# گوڵچنێك

# لە سیفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ

---------------------

الشيخ: إبراهيم بن عبد الله المزروعي

وەرگێرانی

ستافی ماڵپەڕی وەڵامەکان

========================================================

لە بڵاوکراوەکانی

 ماڵپەڕی بەهەشت و وەڵامەکان 

ba8.org

walamakan.com

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم النبيين ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله ، أما بعد :

**قسەکردن لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕاستیدا بەیەك ستوون یان دوو ڕاپۆرت یان سێ کتێب و دانیشتن و نووسین تەواو نابێت و کۆتایی نایەت و زۆر درێژ و نەبڕاوەیە، بەڵام ئەوەی هەیە ئەوەیە کە پێویستە موسڵمان ئاکار ومامەڵە و هەڵسوکەوت و ڕەوشت وخواپەرستی پێغەمبەرەکەی بزانێت بۆ ئەوەی لەخۆیدا ڕەنگ بداتەوە و ڕۆژانە پیادەیان بکات هەتا وای لێ دێت دەبنە خوویەکی دانەبڕاو لێی و بۆ ئەوەی خۆشەویستی بۆی زیاتر بێت. جا لێرەدا باسی هەندێك لە سیفاتە جەستەیی و ڕەوشتیەکانی دەکەین ﷺ :**

## سیفاتی جەستەیی:

*** پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەس دەموچاوی جوانتر بوو وەلەهەموو کەس ڕەوشت و جەستەی باشتر وڕێکتر بوو، وە باڵای نەزۆر بەرز بوو نە کورتیش بوو.**(١)

*** پێغەمبەری خوا ﷺ دەموچاوی سپی و گەشاوە بوو**(٢).

---

(١) ( متفق عليه ).

(٢) ( رواه مسلم ، حديث ٢٤٣٠)

* پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی چوارشانەبوو نێوان شانەکانی پان بوو وە ریشی چڕ بوو. وکان[1]

ئەنەس دەڵێت: " پێغەمبەری خوا ﷺ رەنگی کراوە ودرەوشاوە بوو عارەقەکەی وەکو گەوهەربوو، کە رێی دەکرد بەرەوپێشەوە دەرۆیشت (واتە پێی نەدەخشاند بەزەویدا وئەملاوئەولای نەدەکرد) وە دەستم نەداوە لە هیچ جۆرێك لە ئاوریشم نەرمتر بووبێت لە ناولەپی پێغەمبەری خوا ﷺ وە بۆنی هیچ میسك یان عەنبەرێکم نەکردووە کە بۆنخۆشتر بووبێت لە بۆنی پێغەمبەری خوا ﷺ "[2]

* لە فەرموودەی ئوم مەعبەدەوە هاتووە کە دەڵێت: " پیاوێکم بینی کە رەنگ درەوشاوە و دەموچاو ڕوون وکراوە بوو... ڕوومەتی جوان وسەرنجڕاکێش بوو وە ریشی چڕوپڕ بوو، جوانترین و بەهەیبەت ترین کەس بوو "[3]

جابری کوڕی سەمورە رضي الله عنه دەڵێت:" پێغەمبەری خوا ﷺ دەمی گەورەبوو وە لەتی پێڵوی چاوی درێژ بوو وە گۆشی پاژنەی کەم بوو" [4]

* جابری کوڕی سەمورە دەڵێت: "پێغەمبەری خوا ﷺ تووکی ریشی زۆر بوو"[1].

---

(١) ( رواه البخاري ).

(٢) ( متفق عليه ).

(٣) حديث حسن قوي رواه الحاكم وصححه . قال ابن كثير( قصة أم معبد مشهورة مروية من طرق يشد بعضها بعضاً )

(٤) رواه مسلم ح ٢٣٣٩ ، راجع شرح النووي ١٥/٩٣.

* عه‌لی كوڕی ئه‌بی تالب رضي الله عنه ده‌ڵێت: " پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ نه كورت بوو وه نه درێژیش بوو، سه‌رو ڕیشی گه‌وره بوو"[٢].

* ئه‌نه‌س رضي الله عنه ده‌ڵێت: "قژی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ هه‌تا لای نیوه‌ی گوێی بوو"[٣]

* ئه‌بی ره‌مسه‌ی ته‌یمی ده‌ڵێت: " خۆم و كوڕه‌كه‌م هاتم بۆ لای پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بینیم مووه سپییه‌كانی به خه‌نه سوور كردووه[٤].

* وه پرسیار كراوه له ئه‌بوهوره‌یره كه ئایا پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بۆیه‌ی كردووه؟ ئه‌ویش وتویه‌تی: به‌ڵێ[٥].

* وه له صه‌حیحی بوخاریدا هاتووه كه ئوم سه‌له‌مه تووكێكی له تووكه بۆیه كراوه‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ی ده‌ركردووه. (كتاب اللباس)

* وه ئه‌نه‌س ده‌ڵێت: " من قژی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ م بینی بۆیه كرابوو[٦].

---

(١) أخرجه مسلم

(٢) أحمد والحاكم وصححه الألباني في الشمائل رقم(٤)

(٣) البخاري المختصر رقم(٦٥)

(٤) أبو داود وصححه الألباني في مختصر الشمائل رقم(٢١).

(٥) صححه الألباني في مختصر الشمائل رقم (٣٧).

(٦) مختصر الشمائل رقم (٤٠) ورجح النووي خضاب رسول الله في شرح حديث مسلم رقم (٣٦٣٠) وابن حجر في الفتح في اللباس ، وللمزيد راجع كلام الألباني في مختصر الشمائل تحت الأرقام (٤٠-٤١)

* هه‌ر له ئه‌نه‌سه‌وه ده‌ڵێت: " پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ سێ جار قسه‌ی دووباره ده‌كرده‌وه بۆ ئه‌وه‌ی لێی تێ بگه‌ن"[١].

* له عبدالله ی كوڕی حارسه‌وه ده‌ڵێت: " هیچ كه‌سم نه‌بینیوه ئه‌وه‌نده‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌م به‌ خه‌نده وبزه بێت"[٢].

* وه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ به‌شه‌رمتربووه له كچێكی تازه‌پێگه‌یشتوو له‌نێو په‌رده‌و ژووره‌كه‌ی خۆیدا[٣].

سیفاته ئاكاری و ره‌وشتیه‌كانی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ :

* پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ره‌وشت وئاكاری له‌هه‌موو كه‌س ته‌واوتر و جوانتربوو، وه به‌سه بۆ ئه‌وه راستیه كه خوای گه‌وره فه‌رموویه‌تی: (وإنك لعلى خُلُق عظيم) القلم(٤) واته: به‌ڕاستی تۆ ئه‌ی محمد له‌سه‌ر ره‌وشت وئاكارێكی به‌رز وجوانی.

* ئه‌نه‌س ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌موچاوی له‌هه‌موو كه‌س جوانتر بوو وه ره‌وشت وئاكاریشی له هه‌موویان باشتر وچاكتر بوو[٤].

---

(١) أخرجه البخاري حديث:

(٢) صححه الألباني في مختصر الشمائل رقم(١٩٤)

(٣) متفق عليه.

(٤) أخرجه البخاري.

* هه‌روه‌ها ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌م شڕ و قسه‌ پیس وجنێوده‌ر ونه‌فره‌تكار نه‌بوو[(١)].

* عائیشه‌ ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بۆ هیچ بابه‌ت وشتێكی خۆی تۆڵه‌ی نه‌ده‌كرده‌وه‌ مه‌گه‌ر سنوورێكی خوا پێشێل بكرایه‌ ئه‌وا تۆڵه‌ی ده‌كرده‌وه‌ له‌به‌ر خوا[(٢)].

* وه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ خۆی هانی موسڵمانانی داوه‌ له‌سه‌ر ڕه‌وشت جوانی وفه‌رموویه‌تی:" إن من أحبكم إليّ وأقربكم منيّ مجلسا يوم القيامة أحاسنكم أخلاقاً ""[(٣)]

واته‌: خۆشه‌ویستترینتان به‌لای منه‌وه‌ و نزیكترین مه‌جلیستان له‌ منه‌وه‌ له‌ ڕۆژی دواییدا ئه‌وانه‌تانن كه‌ ڕه‌وشت وئاكاریان له‌ هه‌مووان جوانتر وباشتره‌.

* ئه‌نه‌س ده‌ڵێت: هیچ كه‌س نه‌بوو ئه‌وه‌نده‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ خۆشه‌ویست بێت به‌لای هاوه‌ڵانه‌وه‌ به‌ڵام كه‌ ده‌هاته‌ لایان و ته‌شریفی ده‌هێنا له‌به‌ر پێی هه‌ڵنه‌ده‌سان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ده‌یانزانی پێی ناخۆشه‌[(٤)].

---

(١) أخرجه البخاري.

(٢) متفق عليه.

(٣) أخرجه الترمذي.

(٤) صححه الألباني في مختصر الشمائل رقم(٢٨٩).

* عمره‌ ده‌ڵێت: به‌ عائیشه‌ وترا: ئایا پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ چی ده‌كرد له‌ ماڵه‌وه‌دا؟ ئه‌ویش وتی: ئه‌ویش مرۆڤێك بوو خۆی به‌دوای ئه‌سپێدا ده‌گه‌ڕا له‌نێو كه‌لوپه‌له‌كه‌یدا و شیری ئاژه‌ڵه‌كه‌ی ده‌دۆشی و خزمه‌تی خۆی ده‌كرد[1].

* عائیشه‌ ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌م پیس و جنێوده‌ر نه‌بوو وه‌ له‌نێو بازاڕدا هاواری نه‌ده‌كرد وده‌نگی به‌رزنه‌ده‌كرده‌وه‌ و به‌خراپه‌ پاداشتی نه‌ده‌دایه‌وه‌ به‌ڵكو لێخۆشبوون وچاوپۆشی هه‌بوو[2].

* ئه‌نه‌س ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دای به‌لای كۆمه‌ڵه‌ منداڵێكدا كه‌ خه‌ریكی یاری كردن بوون و سه‌لامی لێكردن[3].

* پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ده‌فه‌رموێت: " أن الله أوحى إليّ أن تواضعوا حتى لا يفخر أحد على أحد ولا يبغي أحد على أحد ""[4] واته‌: خوای گه‌وره‌ وه‌حی بۆ نارده‌به‌وه‌ی كه‌ خاكی و خۆبه‌كه‌مزان بم بۆ ئه‌وه‌ی كه‌س فه‌خر وشانازی و ده‌ستدرێژی نه‌كات به‌سه‌ر كه‌سی تره‌وه‌.

ئه‌نه‌س ده‌ڵێت: من له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دا رێـم ده‌كرد، بوردێكی نه‌جرانی لێوار زبری له‌به‌ردابوو، له‌وكاته‌دا ده‌شته‌كیه‌كی پێ گه‌یشت و بورده‌كه‌ی له‌به‌ری راكێشا

(١) صححه الألباني في الشمائل رقم(٣٩٣).
(٢) أخرجه الترمذي وأحمد وصححه الألباني في الشمائل رقم(٢٩٨).
(٣) رواه مسلم.
(٤) رواه مسلم.

به‌توندی به‌شێوه‌یه‌ك كه‌ لێواری زبری بورده‌كه‌ شوێنی كه‌وت له‌سه‌ر ملی پێغه‌مبه‌ری خوا و وتی: ئه‌ی محمد له‌و ماڵه‌ی خوا كه‌ پێی داوی به‌شم بده‌، ئه‌ویش لای كرده‌وه‌ پێ كه‌نی وپاشان فه‌رمانی كرد كه‌ پێی ببه‌خشن"[1].

* له‌غه‌زای ئوحود دا ددانێكی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ شكا و سه‌ریشی بریندار‌بوو، جا له‌گه‌ڵ لابردنی خوێنه‌كه‌دا ده‌یفه‌رموو: " چۆن گه‌لێك سه‌رفه‌راز ده‌بن كه‌ پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یان بریندار بكه‌ن و ددانی بشكێنن"[2].

* جا پاش ئه‌وه‌ی غه‌نیمه‌ی شه‌ڕی دابه‌ش كرد به‌سه‌ر خه‌ڵكیدا، پیاوێك هات بۆ لای وپێی ووت: له‌م دابه‌شكردنه‌دا مه‌به‌ست بۆ خوا نه‌بووه‌ !! پێغه‌مبه‌ری خوایش ﷺ فه‌رموی: " ره‌حمه‌تی خوا له‌ موسا بێت له‌ڕاستیدا ئه‌و له‌مه‌ زیاتر ئازار درا كه‌چی هه‌ر صه‌بری گرت"[3].

* ئه‌نه‌س ده‌ڵێت: كاتێك له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوادا ﷺ بووین له‌ناو مزگه‌وتدا له‌وكاته‌دا كابرایه‌كی ده‌شته‌كی هات و به‌ووستانه‌وه‌ میزی كرد له‌ناو مزگه‌وتدا، جا هاوه‌ڵان ده‌نگیان به‌رزكرده‌وه‌و وتیان : بوه‌سته‌ بوه‌سته‌، پێغه‌مبه‌ری خوایش ﷺ فه‌رمووی: " میزه‌كه‌ی پێ مه‌بڕن و وازی لێ بهێنن" پاشان به‌و كابرایه‌ی فه‌رموو: " مزگه‌وته‌كان ناشێن

---

(١) متفق عليه.

(٢) أخرجه مسلم حديث:٣٤٣٣

(٣) متفق عليه.

بۆ میز وپیسی کردن بەڵکو دروست کراون بۆ خواپەرستی و زیکری خواو قورئان خوێندن و نوێژ " و پاشان ڕووی کردە هاوەڵانی و فەرمووی: " لەڕاستیدا ئێوە بە کارئاسانکار نێردراون نەوەك بۆ کارقورس کردن، سەتڵێك ئاو بکەن بەسەر میزەکەدا "[1].

* لە عائیشەوە دەڵێـت: جولەکە هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان: " السام علیك" ئەویش پێی وتن: " وعلیکم". منیش وتم: " السام علیكم ولعنكم الله وغضب علیكم "پێغەمبەری خوا فەرمووی: "لەسەرخۆبە ئەی عائیشە دەبێت نەرم ونیان بیت ونەکەیت هەرگیز توند و دەم پیس بیت"[2]، لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: " ئەی عائیشە نەرو نیان بە چونکە ئەگەر خوای گەورە خێری بۆ خانەوادەیەك بوویت ئەوا نەرم ونیانیان تێ دەخات "[3]

* وە لە سیماکانی نەرمونیان و لەسەرخۆیی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیە کە دەفەرموێت: " إني لأدخل في الصلاة وأنا أريد أن أطيل ، فأسمع بكاء الصبي فأتجوز في صلاتي مما أعلم من شدة وجد أمه من بكائه "[4] واتە: جاری وا هەیە دەچمە ناو نوێژەوە بەو مەبەستەی کە درێژی بکەمەوە بەڵام گریانی منداڵێك دەبیستم و نوێژەکەم کورت دەکەمەوە لەبەر ئەوەی دەزانم دایکی چەند بیری لای منداڵەکەیەتی.

---

(١) متفق عليه.

(٢) رواه البخاري

(٣) أحمد ، وهو صحيح

(٤) متفق عليه.

* جا چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ بەبەزەیی نییە لەکاتێکدا خۆی فەرموویەتی: " بُعثتُ بالرحمة ""[١]، واتە: من بە رەحمەت نێردراوم. وە هەروەها دەفەرموێت: " لا یرحم الله من لا یرحم الناس" واتە: خوا رەحم بە کەسێك ناکات کە رەحمی بە خەڵکی نەکردبێت.

* وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی حەسەنی کوڕی عەلی کرد ولەوکاتەدا ئەقرەعی کوڕی حابسی تەمیمی لای بوو، وتی: من دە منداڵم هەیە تا ئێستا ماچی هیچ کامیانم نەکردووە، پێغەمبەری خوایش ﷺ سەیرێکی کرد وفەرمووی: " من لا یرحم لا یُرحم ""[٢] واتە: ئەوەی رەحم نەکات رەحمی پێ ناکرێت.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنانەت بە بەزەیی بووە بەرانبەر ئاژەڵانیش:

* پێغەمبەری خوا ﷺ دای بەلای وشترێکدا کە پشتی دابوی لە سکی (لەبرسێتی ولاوازیدا) و فەرمووی: " لەخوا بترسن لەم ئاژەڵانە".

* پێغەمبەری خوا ﷺ دەفرێکی لار دەکردەوە بۆ پشیلەیەك بۆ ئەوەی ئاو بخواتەوە و پاشان خۆیشی بە پاشماوەکەی دەستنوێژی گرت.

---

(١) أخرجه مسلم

(٢) متفق عليه.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: " فإذا قتلتم فأحسنوا القتلة ، وإذا ذبحتم فأحسنوا الذبحة ، وليحدّ أحدكم شفرته وليرح ذبيحته ""[1] واتە: ئەگەر كوشتتان بە جوانی وباشی بكوژن، و ئەگەریش ئاژەڵتان سەربڕی بە باشی وچاكی سەرببڕن، وە با چەقۆكەتان تیژبێت وسەربڕاوەكەتان ئاسوودەبكەن.

* پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:" من رحم ذبيحة عصفور رحمه الله ""[2] واتە: ئەوەی بەزەیی لەكاتی سەربڕینی چۆلەكەیەكدا كردبێت ئەوا خوای گەورە بەزەیی پێدا دێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو كەس بەخشندەتر ودەستكراوەتر بوو وە بەتایبەت لە مانگی رەمەزاندا زیاتر بەخشینی دەبوو[3].

* ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ داوای هیچ شتێكی لێ نەكراوە لەسەر ئیسلام ئیلا بەخشیویەتی، جارێكیان پیاوێك هات بۆ لای و ئاژەڵێكی زۆری بە ئەندازەی نێوان دوو شاخ پێ بەخشی لە ئاژەڵی صەدەقە، پیاوەكەیش گەڕایەوە بۆ قەومەكەی و وتی: ئەی قەوم وەرن موسڵمان بن چونكە موحەممەد بەشێوەیەك دەبەخشێت كە لە هەژاری و نەداری ناترسێت[4].

---

(١) رواه مسلم.

(٢) صحيح الجامع الصغير

(٣) البخاري.

(٤) رواه مسلم.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( فوالله لو كان لي عدد هذه العضاة نعماً لقسمته بينكم ثم لا تجدوني بخيلاً ولا جباناً ولا كذاباً )[1]. واتە: سوێند بە خوا بە ئەندازەی لق ودڕكی ئەم دارەگەورەیە وشترم هەبێت دابەشی دەكەم لەنێوانتاندا و نامبینن ڕەزیل و ترسنۆك و درۆزن بم.

* پێغەمبەری خوا ﷺ بەشەرمتر بوو لە كچێكی تازەپێگەیشتووی ناو ژوور....[2]

* پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك پیاوێكی بینی لە دەشتاییەكدا خۆی دەشۆرد، سەركەوت بۆ سەر مینبەر و شكور وسوپاسی خوای كرد و پاشان فەرمووی: " إن الله حيي ستير ، يحب الحياء والستر ، فإذا اغتسل أحدكم فليستتر "[3] واتە: خەڵكینە خوای گەورە شەرمی هەیە و داپۆشەری عەیبەشە، و شەرم و داپۆشینی عەیبەی پێ خۆشە، بۆیە كاتێك یەكێكتان خۆی دەشۆرێت با خۆی داپۆشێت و كەس نەیبینێت.

فهذه قطوف من صفاته صلى الله عليه وسلم الخَلْقية والخُلُقية فإذا كنا صادقين في محبتنا له فلنتخلق بأخلاقه وآدابه ولنتمسك بسنته صلى الله عليه وسلم.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين .

---

(١) أخرجه البخاري

(٢) متفق عليه.

(٣) أخرجه أبو داود حديث:٣٥١٥وصححه الألباني ٤٤٧